# یارانی شەممە





نوسینی : ئەحمەد بەهجەت




بۆ چاپ و بڵاوکردنەوە
هەولێر- شەقامی دادگا - ژێر ئوتێلی شیرین پالاص
ت : ٢٢٢١٦٩٥ - ٢٢٢٠٩٠٨- ٢٥١٨١٣٨
مۆبایل : ٠٧٥٠ ٤٦٠ ٥١ ٢٢ - ٠٧٧٠ ١٣٨ ٧٢ ٩١
tafseeroffice@yahoo.com
tafseeroffice@maktoob.com
altafseer@hotmail.com





ناوی نامیلکە: یارانی شەممە

نووسینی: ئەحمەد بەهجەت

و. فارسی : لطیف رشدی

و. کوردی : مستەفا ئیلخانی زادە

بڵاوکردنەوەی: نوسینگەی تەفسیر

ساڵی چاپ: ١٤٢٧ - ٢٠٠٦

نۆرەی چاپ: دوەم

تیراژ: دانە

ژمارەی سپاردن لە کتێبخانەی گشتی هەولێر

٦٤٦ ساڵی ٢٠٠٥

خەڵكی دێی « ئیلە » بە ڕاوەماسی ، دەژیان . خەلكی ئەو ناوچەیە ، پاش ماوەی هۆزی بەنیئیسرائیل بوون . بەنیئیسرائیل ، رۆژی شەممەیان لا پیرۆز بوو . لەو رۆژەدا عیبادەتیان دەكرد . لە رۆژی شەممەدا كەس كاری دنیایی نەدەكرد .

ڕاوەماسی و ئاور كردنەوە ، لە رۆژی شەممەدا حەرام بوو . بە گوێرەی دەستووراتی ئاینی یەهوود تاوان باران دەبوو سزا بدرابان .

خەڵكی ئەو دێیە بە بازرگانی و فرۆشتنی ماسی دەژیان . هەر بۆیە باری ئابووری و ژیانیان زۆر باش بوو . رۆژێک خودا ویستی ئەو خەڵكە تاقی بكاتەوە .

لە ڕۆخی زەریا و لە نزیک ئەو دێیە دوو بەردی گەورەی سپی لێ بوو . ماسییەكان لە شەو و رۆژی شەممەوە تا دوا كاتی ئەو رۆژە ، دەهاتنە تەنیشت ئەو بەردانە .

لەو رۆژەدا ، ماسییەكان لە دەس ماسییەگرەكان لە ئەمان دابوون ، چونكە ئیتر تۆڕی ڕاوەماسی ڕاوچیەكان ڕێگری گەڕان و كایەی ئەوان نەدەبوون . ماسییەكان لە هەل و مەرجی ئەو رۆژە كەڵكیان وەردەگرت و لە ڕۆخی زەریا ، بە سەربەستی كایەیان دەكرد .

كاتێ رۆژی شەممۆ ، تەواو دەبوو ، ماسییەكان هەستیان دەكرد كاتی ئاسایش و ئازادی تەواو بووە . دەچوونە شوێنی قووڵ و ئەو جێیانەی دەستی ڕاوچیانی پێڕانەدەگەیشت و خۆیان دەشاردەوە . لێرەدا بۆ ماسیگرەكان راوەماسی دژوار دەبوو .

هێندە ئەو رووداوە دووپات بووەوە ، خەڵكی دێ لە هەڵس و كەوتی ماسییەكان گەیشتن و ئەو پرسیارەیان هێنا گۆڕێ : « ئایا ماسییەكان بیر و هۆشیان هەیە ؟ ئایا ئەو زیندەوەران خاوەنی جۆرێک سرنج و تێگەیشتنن ؟

دیاره ئەگەر وەڵام سەلبی بێ یانی تێناگەن کەوا بوو چلۆن ڕۆژانی شەممە بەو پەڕی متمانە و ئاسایشەوە لە ڕۆخ زەریا خۆدەردەخەن و لە ڕۆژەکانی دیکەدا خۆیان لە ڕاوچیەکان دەشارنەوە ؟ »

« ئایا ئەو زیندەوەرانە ، ڕۆژەکانی حەوتوو لێک جیا دەکەنەوە ؟ ئایا دەزانن لە حەتوودا کام ڕۆژ شەممەیە یان بۆیان بووە بە عادەت ؟ »

ئەو مەبەستە ببووە هۆی سەرسوڕمانی ماسیگرەکانی دێ و ئەوەیان زۆر پێسەیر بوو کە ئەو زیندەوەرانەی ناو زەریا چۆن هەڵە ناکەن .

بارودۆخی ئاوایی یەکجار زۆر گۆڕابوو ، چونکە ماسیگرەکان بە تۆڕی خاڵییەوە دەگەڕانەوە ماڵ .

گەورە گەورەکانی دێ لە دەوری یەک کۆ بوونەوە هەتا بەو کارە ڕابگەن و چارەیەک بدۆزنەوە .

یەکێکیان گوتی : « بازاڕ خاڵی بووە لە ماسی و هەرچی ڕاودەکرێ لە ماسییە چکۆلەکانە کە بە کاری کڕین و فرۆشتن نایەن .

گەورەی ماسیگرەکان تۆڕەکانمان لە حاڵێکا بە با هەڵمساون و بە ئاوی زەریا تەڕ بوون ، بێ ماسی دێنەوە سەر ئاو . هەوا بەرەو سەرما دەچێ و وەرزی زستان نزیک دەبێتەوە . کەوا بوو کێ دەتوانێ خۆی و ماڵ و منالی تێرکا ! »

یەکی دیکە کوتی : « ئەو ماسییانە تەواو نارەحەتمان دەکەن . ئەوان لەو ڕۆژەیدا ڕاوی تێدا حەرامە ، دێنەدەرێ بەڵام ڕۆژەکانی‌تری حەوتوو خۆدەشارنەوە ! »

ئەو شتە کەوتە سەر زمانان و بوو بەهۆی بیروڕای جیاواز ، دەستەیەک لە ئیمانداران دەیان

کوت : « وێدەچێ خودا بیەوێ تاقیمان کاتەوە ، کەوابوو دەبێ سەبر بکەین و درێژە بە راوە ماسی و چوونە زەریا بدەین ، کێ‌دەزانێ ، مومکینە خودای گەورە ئەو بەڵا و تاقی کردنەوەمان لە سەر لابا و ببێتە هۆی زۆر بوونی رۆزی ئێمە . »

تاقمێک لە لاساران کوتیان : « نابێ تەسلیم بین ، ئەو ماسییانە فێڵمان لێدەکەن ؛ نابێ بهێڵین گاڵتەمان پێ‌بکەن . »

یەکێک لە ئیمانداران پرسی : « مەبەستی ئێوە لەو قسانە چییە ؟ »

لاسارەکان کوتیان : « چاوەڕوان بن بزانن چ‌دەکەین . »

دووبەرەکایەتی کەوتە ناو خەڵک و ئەو کۆڕە لێک بڵاو بوون و هەر کام بە بیرێکەوە چوونەوە بۆلای ماڵ . تاقمی لاسار و سەرەڕۆ ، لە شەوێکی تاریکدا ، بڕیارێکی رەش و تاریکیان لە بارەی دەستوراتی دینی خۆیان دا و کوتیان : « کاتێ ماسییەکان فێڵ لە ئێمە دەکەن بۆ ئێمە فێڵ لەوان نەکەین ؟ رۆژی شەممە تۆڕەکانمان لە زەریا داوێین . ماسیەکان دەکەونە ناو تۆڕەوە و رۆژی یەکشەممە زارکی تۆڕەکان وێکدێنین هەتا دیسان نەگەڕێنەوە ناو زەریا . بەو جۆرە ئێمە گوێمان داوەتە دەستووراتی دینی خۆمان کە ڕاوی لە رۆژی شەممەدا بە حەرام داناوە و لە هەمان کاتیشدا ، راوەماسی خۆشمان کردووە . »

یەکێ لەوان لە حاڵێکا بیری دەکردەوە ، کوتی : « دێ پڕە لەو حەوزۆکانەی ئاوی زەریا دەچنە ناویانەوە . ئێمە چاوەڕوان دەمێنینەوە هەتا ماسییەکان بچنە ناو حەوزۆکەکانەوە و ڕێی گەڕانەوەیان بۆ زەڕیا لە پێش ئەوەیدا هەڵێن ، دەگرین و لێدەگەڕێن کاتێ بوو بە یەکشەممە بە تۆڕ دەیانگرین . »

یەکێکیان لە حاڵێکا نێوچاوانی تێکنا بوو کوتی : « ئەوانە فێڵ و دەهۆ کردن لە دینە و کایە پێکردن بەدین ... ئەگەر کردمان چ‌دەبێ ؟ »

ئەوان دەنگی عەقڵیان کە لەو ڕووداوە خائینانەدا کەمێ ڕوون بوو ، کڕ کرد و کوتیان : « هیچ ڕووداوێک نابێ . »

ڕۆژی شەممە هات ، ستەمکاران فێڵ و پیلانی خۆیان بە جێ هێنا . ماسییەکانیان زیندانی کرد و تۆڕەکانیان لە حەوزۆکەکان خست و تەواوی ماسییەکان کەوتنە ناو داوی ڕاوچیەکان و ئەوانیان ڕۆژی شەممە لە حەوزۆکەکان هێنا دەر .

لە ڕۆژی یەکشەممەدا دێی ئەوان جێژنێکی بە خۆیەوە بینی و لەو جێژنەدا بە کردنەوەی ئاور و وڵات چراخان کردن هەتا ڕۆژ خواردیان و هەڵپەڕین . ڕۆژی دوایە ئیمانداران کە لەو ڕووداوە ئاگادار بوون سەر سوڕما و گێژ بوون . یەکێکیان پرسی : « ئەو هەموو ، ماسییە چۆن گیرا ؟ »

لادەرەکان کوتیان « ئەوانەمان بە هەوڵ و زیرەکی خۆمان گرت ! »

ئیمانداران کوتیان : « ئایا لە ڕۆژی شەممەدا ڕاوتان کردن ؟ »

بەرهەڵستکاران کوتیان : « ئێمە ڕۆژی یەکشەممە ڕاومان کردن و بەر لە ڕۆژی یەکشەممە چووین بۆ قەراغ زەریا بێ ماسی گەڕاینەوە . زەریا ماسی تێدا نەبوو ، ئێوە لە کوێتان ڕاو کردن ؟ »

بەرهەڵستکاران کوتیان : « لە زەریامان گرتن ! چونکە ماسی لە ئیشکاییدا نابێ . »

ئیمانداران لە وتەی بەرهەڵستکاران کە ماسییەکان فێڵیان لە ئێمە کرد و فێڵیان لیدەکەین ، زانیان کە ڕووداوێک ڕوویداوە .ئەوان بڕیاریان دا تا ڕوونی کەنەوە ئەو ڕووداوە چیە .

لە رۆژی شەممەدا بەرهەڵستکارانیان خستە ژێر چاوەدێری و شەوی سەر بەو رۆژە تا سبەینێ نەنوستن . ئیمانداران لە فێڵ و تەڵەکەی بەرهەڵستکاران گەیشتن و ئەوانیان شەرمەزار کرد .

ئیمانداران کوتیان : « ئەو شتە فێڵ کردن لە دینە و لە ئاکامی ئەوەدا عەزابێکی کوشندە چاوەڕوانتانە ، بۆ لای خودا بگەڕێنەوە و لەو گوناهەی خۆتان تۆبەبکەن . »

بەرهەڵستکاران ، دڵڕەق ببوون و دەنگی عەقڵیان کەمتر ببوو . ئەوان ئامۆژگارییەکانی ئیماندارانیان گوێ نەدایە و پێداگر بوون لە سەر فێڵ و پیلانەکانیان . هەر وەها ئیتاعەیان لە فەرمانەکانی خوا نەدەکرد و دەیان کوت : « ئێمە سەربەستین و دەتوانین هەر چونێک بمانەوێ راو بکەین و ناهێڵین ماسییەکان فێڵمان لێبکەن . »

خەڵکی دێ بوون بە سێ بەش ، بەشێکیان جەماوەریان بۆ کاری چاک هاندەدا و لە کاری خراپیان لادەدان ، بەشێکیان فێڵ و گزەیان لە دینی خۆیان دەکرد . تاقمی سێهەمیش هیچیان نەدەکرد ئەو بار و دۆخەیان خستبووە ژێر چاوەدێری و خۆیان لە کار و بار
نەدەدا .

خەڵکی دێ لە گەڵ یەکتر کەوتنە ململانێ . ئیمانداران زۆر کەم بوون و بەرهەڵستکاران زۆرینە بوون . بەو حاڵەشەوە تێک هەڵچوون لە ناو ئەو دوو تاقمەدا زۆرتر بوو . پاشان تێکهەڵچوونەکە راوەستا و لە جێیەک کۆ بوونەوە و وت و وێژیان کرد . ئەو تاقمە کە خۆیان لە شەڕ و کێشە ، پاراست بە ئیماندارەکانیان کوت : « بۆ ئامۆژگاری تاقمێک دەکەن کە خودا عەزابێکی گەورەیان دەداتێ . »

ئیمانداران کوتیان : « لە خودا داوای لێبۆردن دەکەین »

« لەبەر ئەوە ئامۆژگاری ئەوان دەکەین تا خوا بمانبەخشێ و بزانێ ئێمە ئەرکی خۆمان بەجێ هێناوە هەر وەها بۆیە ئامۆژگاری ئەوان دەکەین هەتا لای خوا تۆبە بکەن لەو گوناهانەی کردوویانە و لە زەلکاوی ئەو گوناهانەی تێیداا نوقم بوون بێنەدەرێ .

تاقمی بێلایەن کوتیان : « لێیان گەڕێن هەتا عەزاب بکرێن ئەوان شایانی ئامۆژگاری نین .»

بەرهەڵستکاران بە ئیماندارانیان کوت : « لە دێ بچنە دەرێ و بۆ ئێمەی بەجێ بێڵن . » ئیمانداران کوتیان : « لێرە ناچینە دەرێ چۆن دێی ئێوەیە ، دێی ئێمەشە . »

دیسان تێکهەڵچوون لە نێوان خەڵکی وێدا دەس پێکراوە ، پاشان هەموو لە سەر ئەوە رێککەوتن دیوارێک لە نێو ئیمانداران و بەرهەڵستکاران دروست بکرێ . ئەوان بڕیاریاندا دێ بکەنە دوو بەشی گەورە و چکۆلە ، بەشی گەورە بۆ بەرهەڵستکاران و بەشی چکۆلە بۆ ئیمانداران . پاش ماوەیەکی کورت دیوار دروست بوو .

باری ئابووری و دارایی بەرهەڵستکاران ، زۆر باش ببوو ، سامانیان زۆر ببوو ، بەو سامانە کۆشکی جوان و رازاوەیان ساز کرد و زێڕ و جەواهێریان کڕی .

ئیمانداران ناهۆمێد نەبوون و دیسانیش دەستوور بە چاکە و خۆپاراستن لە خراپەیان کرد و داوایان لە خەڵک کرد بۆ ئیتاعە لە فەرمانی خودا و ڕێزگرتن لە دەستوورەکانی دین . بەڵام بەرهەڵستکاران بە ئامۆژگاری ئیماندارانیان لە گوێ نەگرت و وەدوی بەرهەڵستکاری لە گەڵ دین و ئەنجامدانی ویستەکانی شەیتان کەوتن . بەرهەڵستکاران بە ئاشکرایی دژایەتی فەرمانی خودایان دەکرد .

خوداش له بەرهەڵستکاران بێزار بوو و پێی فەرموون : « ببن به مەیموونێکی رژد و چەپەڵ » له ناکاو بەرهەڵستکاران بوون به مەیموونێکی رژد و چەپەڵ ، له حاڵێکدا ئێستاش زێڕ و جەواهێراتەکەیان له دەست و مل دامابوو . خودای گەورە به هۆی بەرهەڵستکاری و پیله کردنی بەرهەڵستکاران ئەوانی مەسخ کردبوو کردبوونیه مەیموون .

بەرهەڵستکاران له پلەی مرۆڤایەتی و پایەی بەرز ، کەوتنه ناو زیندانی ئاژەڵی مەیموونەکان له حاڵێکا خۆیان به مرۆڤ دەزانی . ئەو مەیموونانه وەک مەیموونەکان نەدەجوڵانەوە و هەستیان به مەیموون بوون نەدەکرد . ئەوان دەستیان کرد به زیکەزیکێکی خەماوی و هەوڵیان‌دا قسه بکەن ، بەڵام نەیان توانی . چوونه لای خزم و هاوسێ ئیماندارەکان له حاڵێکا لێیان دەپاڕانەوە و خۆیان به سەر قاچیان‌دا دەخستن ، تێدەکۆشان ئەوان لەو شتەی رووی داوە ئاگادار بکەن . دیتنی مەیموونەکان ببوو به هۆی پەژارەی ئیماندارەکان . به پەله چوون بۆ لای کۆشک و شەقامەکانی بەرهەڵستکاران . دیتیان ئەوانه پڕ بوون له مەیموون و مەیموونەکان دەلووریێنن و له تاوی ئازار و پەشیمانی قژ و مووی خۆیان دەڕنیەوە .

ئیمانداران لەوەی رووی دابوو ئاگادار بوون . ئەوان هەستیان کرد له ترسان دڵیان ئۆقره ناگرێ . چونکه مەیموونەکان به گریانەوە پەنایان بۆ ئیمانداران هێنابوو .

ئیمانداران له تاو ئازار و ناڕەحەتی مەیموونەکان که له ئینسان بوون ڕابووونه ئاژەڵ

خەمناک بوون . چونکە توانای یارمەتی دانی ئەوانیان نەبوو و نەیاندەتوانی لە ئازاری مەیموونەکان کەم بکەنەوە . ئیمانداران بڕیاریان دا تا دێ بەجێ بێڵن و ڕۆژی ئەوێیان بۆ مەیموونەکان بەجێ بێڵن . لێرەدا بوو کە بەسەر هاتی یارانی شەممە خەریک بوو لە بیر دەچووەوە بەڵام قورئان وەک داستانێک گێڕاویەتەوە .